بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

پێش ساڵانێك لەمەوبەر هەركات فایلێكی وێب كێشەی تێبكەوتایە ، وە یان دایرێكتەری سەب فولْدەرێك لەسەر هۆستێك نەكرایەتەوە ، بێگومان دەبووە كێشە و خەڵك كە ئەو هۆستەی دەكردەوە وای دەزانی خەتی نەماوە ، یان وای دەزانی ئینتەرنێت ئیتر ئیش ناكات ، زۆر شتی دیكە دەربارەی كێشەكانی دیكەی ڕیدارێكتەری ووێب هۆستەكان هەبوون كە زۆر بەشیوەیەكی ناشرین كاتێك كەدەتكردەوە پیشان دەدران ، ئەوە بووە هۆی پرسیارێك لای بەكارهێنەر و دروستكرانی (ووێب سێرڤەر)ەكان ، داڕێژە و دیزاینەرانی ووێب هۆستینگ دواتر ئەو كارەیان لەئەستۆ گرت بۆ شیوازكردنی ئەو جۆرە هەڵانە و ئێستاش لەسەر زۆربەی ووێب سێرڤەرەكان ئەپڵیكەشنەكە كارایە.

لەسەرەتاوە بیركرایەوە كە فایلی ڕێگەپێدراو ئەژمار بكرێت بەپێی سەردانكەرانی هۆستەكە ، بۆ ووێنە كەسانی ناو كۆمپانیای دروستكەر بتوانن چۆن و بەچ شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ فایلەكاندا بكەن ، وە كەسانی دەرەوەی كۆمپانیا ، واتە خەڵك چۆن لەسەر هۆستێك چ فایلێك بەكار بهێنن و ببینن و چ فایلێك ڕیگە پینەدراوبێت؟




بۆ ئەو مەبەستە هەستان بەدرووستكردنی چەند ئەپڵیكەیشنێكی بچوك و دامەزراو بەناونیشانی (كۆنفیگەری وێب سێرڤەرەكان) ئەم كۆنفیگەرە لەسەر دامەزراوەی ناوخۆیی جیاواز دەهاتەپێشچاو ، بۆ ووێنە دەتوانرا ئەم كارانە بەپێی ئەپڵیكەیشنەكان دابەش بكرێت ، لە هەنوكەدا كارەكان بەرەو پێش چوون و جودا كراوەن:

## كاری پاڵاوتن (**Requests Filtering**)

پالاوتن سەرەتایەك بوو بۆ پێشكەوتنی وویب هۆستینگ ، لایەنی پارێزگاری ئەو سێرڤەرە بەرز دەكاتەوە بۆ پێكهێنەرەكانی و درووستكەرانی دارێژەر دەبن بۆ هەماهەنگی بابەتە بینراوەكان. كاری پالاوتن لەهەنوكەدا بەم شێوەیە دادەڕێژێت:

- ناوی فایلەكان و پاشگرەكەی (**File Name and Extensions**)

بۆ هەموو بەكارهێنەرانی كۆمپانیای بونیادنەر دەتوانێت فایلەكان و پاشگرەكانی ڕێگەپێدراوە و دەتوتنێت كاریان لەسەر بكات ، بۆ ووێنە (**exclude**. ، **webinfo**. ، **cd**.)هەتا دوایی ، لەم بەشەدا دەتوانرێت لەسەر ئەپڵیكەیشنەكە ڕاگەیاندراوێكی دیكە بۆ پاشگرەكان دابنرێت.

- یاساكان (**rules**)

یاساكان بەر لەهەموو شتێك پێویستیان بەناوێك هەیە بۆناسینەوە ، پاش ئەوە دەبێت یاسا بەشیوەی دەق بنووسرێت كە ئەپڵیكەیشنەكە دەقەكان دیاری دەكات ، پاش ئەوە دەبیت جێبەجێ بكرێت بەسەر پاشگرەكاندا.

- فایلە شاراوەكان

بریتین لەو فایلانەی كە تەنها لەسەر ڕیڕەوە لۆكاڵیەكانی كەسی درووستكەر دەبینرێت و دەتوانێت ئەو گۆڕانی تێدا بكاتن بۆ ووێنە فایلەكانی (**web.config** ، **bin**).

- **URL**

بەشێكی گرنگ و كۆن ، پێدانی پالاوتەكاریە بۆ ڕێڕەوەكان ، بەكارهێنەری هۆستەكە كام ڕیڕەو ببینێت و كام ڕێڕەو نەبینێت؟.

- **Headers**

ئەم كردارە نوێیە و زۆر گرنگە ، لەزۆربەی وویب سێرڤەرەكاندا دووبارە بووتەوە و هەیە ، ئیشی سەرەكی ئەم كردارە بەهۆی قەبارە دەكرێت.

وە چەندانی تر لەسەر كاری پالاوتن زیاد دەكرێت بەهۆی یاساكانەوە.

ڕێڕەوی پشتگیری خۆیی دۆسیەكان (**Default Document**)

ڕێڕەوكاری خۆیی دۆسیەكان لەسەر فایلێكی جێگیر دامەزراوە ، كە بەشێوەیەكی خۆكارانە ئەو فایلە دەستیشان دەكات بۆ كردنەوەی سەرەتا ، لێرەدا بۆ ووێنە لەسەر ڕێڕەوێك چەند فایلێك هەن ، لەو فایلانە كامە (ناو وە پاشگر) دەبنە یەكەم كرانەوەی خۆیی؟ ، بۆ ئەو مەبەستە دەبێت ئەپڵیكەیشنێك هەبێت هەتا ئەو فایلانە بناسێتەوە لەسەر سێرڤەر و بیكاتە یەكەم فایلی كراوە ، بۆ ووێنە كە دەنووسین (**www.example.com**) لەوێدا چەند فایلێك هەیە كە دەبێت یەكێك لەو فایلانە یەكەم جار لەكاتی كرنەوەی هۆستەكە بكرێنەوە بۆ ووێنە:

Default.php

Default.htm

Index.html

Index.php

Default.asp

..Etc

وه هەتا دوایی

،بۆ ڕێرەوەکانی دیکەش بەهەمان شێوە دەبێت بۆ ووێنە (www.example.com/sub)

## هەڵەکان (Error Pages)

مەبەست لەهەڵەکان دەستەبەرکردنی ئەو دایرێکتەریەیە کە هەلەی تێ دەکەوێت ، لەلایەن بەکارهێنەرانەوە ، هەلەکانیش بەم شیوانە درووست دەبن:

- هەڵە ناوخۆییەکانی ووێب سێرڤەر: بریتین لەو هەلاَنەی لەکاتی داڕشتن ڕوو دەدات.
- دەستگیراوەکانی بواری هاکینگ: بریتن لەو هەلاَنەی کە هاککەرێك درووستی دەکات.
- ڕێڕەوە نەبووەکان: ئەم هەلاَنە کاتێك درووست دەبێت کە فایل و ڕێڕەو نەبێت لەسەر سێرڤەرەکە.
- هێرشەکان: بریتین لەو هەلاَنەی لەکاتی هێرشکردن ڕوو دەدەن ، بۆ ووێنە بۆسەر بەشێکی سێرڤەرەکە.
- هەڵە درووستکراوەکان: بریتین لەو هەلاَنەی کەسی داڕێژەر درووستی دەکات بۆ مەبەستی پاراستن.

هەتا دوایی...

هەڵەکانیش دەکرێت بە چوار بەشەوە:

**1.** هەڵەکان بەشێوەی کاتی زانیاریەك دەبەخشن (**Informational**) ، پێش کردەیین و دەتوانین پێش کردنەوەی پەڕگەکان بەشێوەیەکی کاتی شتێك ڕابگەینن ، بۆ ووێنە:

## Are you a cat?

Our dogs are currently sniffing and inspecting your browser to see if you came here with good intentions.

Unfortunately we get alot of visits from cats, this check prevents them from accessing the website.

If you are able to see this then no worry, you will be redirected to **com** soon.



هەڵەکانی **Informational** لە ژمارەکانی **1xx**دا دەست پێ دەکات.

| **1xx Informational** | | |
|---|---|---|
| ژ | ناونیشان | کورتەی ژمارە گرنگەکان |
| **100** | **Continue** | دەگەڕێتەوە سەر ئەو بارەی کە پێشتر ڕاگەیەندراوە ، بەهۆی ناونیشانە تۆمارکراوەکان ، بۆ نموونە ناونیشانی زانیاری کەسی تۆ پەیوەندە بە ڕاگەیەندراوێکی داڕێژراو. |
| **101** | **Switching Protocols** | ڕاگەیەندراوەکە لەسەر سێرڤەر پرسیار دەکات بۆ گەیشتن بە پەیوەندی بەستراو **ACK** |
| **102** | **Processing** | کات بۆ ڕاگەیەنراوەکە دادەنێت تا هۆست ، سەب هۆستەکان بکاتەوە. |

**.2** ڕاگەیەندراوەی دەرەنجام (**Success**) ، ئەم ڕاگەیەندراوەیە پاش ئەو کاتە دێت کە کردارێك لەسەر سێرڤەر بەئەنجاك بگات و ئەو ئەنجامەش ڕابگەیەنریت لەلایەن داڕێژانەوە ، واتە ئەوان ڕیگە بەو ڕاگەیەندراوە دەدەن ، لەژمارەکانی **2XX Success** دەستپێدەکات:

| **2XX Success** | | |
|---|---|---|
| ژ | ناونیشان | کورتەی ژمارە گرنگەکان |
| | | بەشێوەیەکی خۆکار لەسەر پرۆتۆکۆڵی **HTTP** دادەمەزرێت ، ئەو کاتە دەستەبەر دەبێت کە ڕاگەیەندراوەکە بەتەواوەتی جێگیرکرابێت لەسەر میتۆدەکانی **GET** و **POST** لە |

| | | |
|---|---|---|
| 200 | ok | لە GETدا فایل ئەگەرچی لەسەر کلاینت جێگیر نەکرابێت بەمەرجێ کرابێتەوە ، ئەوا بەجێگیر و ژمارە 200 دادەنرێت و را گەیەنراوە ، وە لە POSTدا کلاینت رای دەگەیەنێت و پۆستی دەکات ، بۆ ووێنە دانانی بابەت 200. |
| 201 | Created | ڕاگەیەنراوەکە لەم کاتەدا بەجێ گەیەنراوە ، وە جێگیرە و بووتە هۆی درووستبوونی ڕاگەیەنراوێکی دیکە لەلایەن بەکاربەرەوە. |
| 202 | Accepted | ڕاگەیەندراوە لەکاردایە و بەڵام تەواو نەبووە لەکاری خۆی. |
| 203 | Non_ Authoritative Information | ڕاگەیەنراوە تەواو لەکاردایە ، بەڵام بۆ هەندێك سەرچاوە لەکارخراوە. |
| 204 | No Content | ڕاگەیەنراوە تەواو لەکاردایە ، بەڵام ڕێگە پێنەدراوە بۆ گەڕانەوە بۆ ناوەڕۆکی سۆرسەکان. |
| 205 | Reset Content | وەك ئەوەی سەرەوە ، بەڵام لێرەدا دەتوانین دۆسیەکان ڕێگە پێدراون بە دووبارە چاوپێداخشاندنەوە لەلایەن کلاینت ، نموونەی زۆربەی هەرە زۆری هۆستەکان لێرەدایە. |
| 206 | Partial Content | --- |
| 207 | Multi_Status | ڕاگەیەنراوە کار بەفایلەکانی XML دەکات بۆ پشتگیری کردنی ڕێچکە و ڕێڕەوە لقدارەکان ، نموونە (example.com/sub). |
| 208 | Already Reported | --- |
| 226 | IM Used | لێرەدا سێرڤەر بەتەواوەتی ڕاگەیەنراوەی GETی لەدەستداوە. |

3. گەڕانەوەی خۆکار (Redirection) ، زۆرێك لە هەڵە پیشاندراوەکانی سەر سێرڤەر لەکاتی بەکۆد کردنیان لەلایەن دارێژەرانیەوە ، پێویستیان بە گەڕانەوەی خودکاری دەبێت ، ئەم گەڕاندنەوەیە لەسەر کردارێك ئەنجام دەدرێت کە ڕاگەیەنراوەکان لەلایەن کلاینتەوە تەواو نەکراون ، واتە ( POST و GET) لێرەدا تەواو کاری پەیوەندی ئەنجام نادات بەهۆی هەندێك یاساوە ، بەڵام بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی خۆکار ڕێڕەوکاری بکرێت ، پێویستمان بۆ کۆدەکاتی Redirection دەبێت.

ئەم جۆرەش لە ژمارەکانی 3xx وە دەست پێ دەکات:

| 3xx Redirection | | |
|---|---|---|
| ژ | ناونیشان | کورتەی ژمارە گرنگەکان |
| | | سێرڤەری هۆستێك بەرگری دەکات لە پێشنیارکراوە هەڵەکەی ، بە دانانی چەند هەڵبژاردنێکی دیکەی داڕێژراو ، لێرەدا تۆ ئەو هەڵبژاردنانە یەکیان دەستیشان دەکەیت بۆ گەڕانەوەی بۆ شوێنی دەستنیشان کراو ، گەڕانەوەی خۆکار بەپێی هەڵبژاردن لەلایەن دیوی |

| | | |
|---|---|---|
| 300 | Multiple Choices | کلاینتەوە دەبێت ، ئەم هەڵەیەش مەرجی هەیە:<br>1. نەگونجانی هەریەك لە IPبەکاربەر و DNSی سێرڤەر بەهۆی کێشەی دیاریکراوی یاسایی ناو ئەپڵیکەیشنێکی سێرڤەرەوە ، ڕوو دەدات.<br>2. هەڵە لەم بارەدا بەهۆینەگونجانی پەیوەندی IP لە سۆکێتەکان ڕوو دەدات.<br>3. درووستبوون و نووسینەوەی HTTP لەکاتی پەیوەندی گرتن.<br>4. گەڕانەوەی سۆکێتە دیاریکراوەکان بۆ پەیوەندی گردتن لەنێوان کلاینت و سێرڤەر لەسەر پرۆتۆکۆڵی HTTP.<br>هەموو گەڕانەوەیەك لەم ژمارەیەدا بەپێی لیستی پاشگرەکان کاردەکات ، بۆ وینە ڤیدیۆ..هتد. |
| 301 | Moved Permanently | گەڕانەوە ئاراستەکراوە بۆ شوێنێکی دیاریکراو. |
| 302 | Found | ئەم کردارە گرنگە بۆ گەڕان و دۆزینەوەی کردارێکی گرنگی پیشەیی پێویست لەکاتی گەڕاندنەوەی لینکەکاندا بۆ شوێنی مەبەستدار ، کە مەبەست لێی گەڕانەوەیە بۆ ئەو شوێنەی کلاینت پێویستیەتی ، واتە لەهەمانکاتدا ناسینەوەیەکی پەنهان پیشان دەدات ، خزمەتگوزاری RFC بەژدارە لەو ناسینەوەیەدا. |
| 303 | See Other | لێرەدا وەلامدانەوە بەپێی ناسینەوە دەبێت ، وە لەسەر میتۆدی GET کار دەکاتن. |
| 304 | Not Modified | --- |
| 305 | Use Proxy | وەلامدانەوە ، یاخود گەڕانەوەی خۆکار لەو کاتەدا دەبێت کە دیوی کلاینت پرۆکسی بەکار بهێنێت ، نموونە زۆرە بۆ ئەمە ، بۆ وینە کاتێك ئەکاونتێك درووست دەکەین بە HTTP پرۆکسی ، لە شوێنێکی دیاریکراو ، ئەگەر ئەم حاڵەتە چالاك بێت لەسەر سێرڤەر ئەوا ڕێگە نادات و ژمارە بەیان دەکات بۆ ناسینەوە. |
| 306 | Switch Proxy | ڕێگە دەدات بەبەکارهێنانی پرۆکسی ، بەلام خۆکاریە و دەیەوێت پرۆکسی سێرڤەرەکانی خۆی بەکار بباتن. |
| 307 | Temporary Redirect | --- |
| 308 | Permanent Redirect | وەلامدانەوە و هەموو پێکهاتە دارێژراوەکانی بە بەکارهێنانی URI جیاواز وەلام وەردەگرێت ، بەلام بەبێ بەکارهێنانی پرۆتۆکۆڵی HTTP. |

# Multiple Choices

The document name you requested (/....foca) could not be found on this server.

Available documents:

- /. (common basename)
- /.. (common basename)
- /.receivers_full_ok.txt (common basename)
- /.state_www10_emit.txt (common basename)
- /.#robots.txt.1.17 (common basename)
- /.Overview.html.swp (common basename)
- /.state_w3c1.txt (common basename)
- /.state_www10.txt (common basename)
- /.web_base (common basename)

**4.** هەڵەکانی سەر سیستەمی کڵاینت (**Client Error**) ، بەکارهێنەرانی دەرەوەی سێرڤەرەکە ، واتە بەکاربەی هۆستە درووستکراوەکان لەلایەن بەکارهێنەرانیەوە هەڵەکە درووست دەکات ، بۆ ووێنە من بەکارهێنەرێکی سایتی گۆگڵم کاتێك ئەو سایتە دەکەمەوە.

تێبینی/ لەم ڕێڕەوە لەسەر سێرڤەری **iis** هەڵەکان ڕیك دەخرێن:

**C:\inetpub\custerr\en_US**

ژمارەی دەستپێك **4xx**ە :

| **4xx Client Error** | | |
|---|---|---|
| کورتەی ژمارە گرنگەکان | ناونیشان | ژ |
| وەڵامدانەوەی هەڵە درووست دەبێت بەهۆی هەڵەی ڕستەکان (**syntax**) ، بۆ ووێنە هەلەی کۆدەکانی **php** ، **mysql** ، **js** ..هتد یاخود هەلەی کۆدەکانی نێو ئەپڵیکەیشنەکانی سەر سێرڤەر ، یەکێ لەیاساکان. | **Bad Request** | **400** |
| --- | **Unauthorized** | **401** |
| --- | **Payment Required** | **402** |
| داواکاری لەلایەن کڵاینتەوە ڕاستە و بەجێیە ، بەڵام لەلایەن دیوی سێرڤەرەوە وەڵام نادرێتەوە یاخود ڕیگە پێنەدراوە. | **Forbidden** | **403** |
| داواکاریەکە ڕاستە و بەجێیە ، بەڵام لەلایەن دیوی ووێب سێرڤەرەوە نادۆزرێتەوە و بەجێ نیە ، بەڵام ئەگەری هەیە لە داهاتوودا ئەو داواکاریە بەجێ بهێنرێتەوە ، لەهەردولا یان لەیەك لا. | **Not Found** | **404** |

| | | |
|---|---|---|
| 405 | **Method Not Allowed** | وەڵامدەرەوە بەشێوەیەك لەشێوەكان تەواو و بەجێیە ، بەڵام لەكاتی پۆستكردن ئەم وەڵامدانەوەیە وەرناگیرێت ، حاڵەتەكانی ڕوودانی ئەم هەڵەیە لەسەر (**POST** و **GET**) كار دەكاتن ، كاتێك تۆ شتێك لە ناو فۆرمێك دەنوسیت بە میتۆدی **GET** بەڵام كاتێك پۆست دەكەیت ئەم حاڵەتە روو دەدات. |
| 406 | **Not Acceptable** | --- |
| 407 | **Proxy Authentication Required** | هەڵە ڕوو دەدات كاتێك كلاێنت پرۆكسی بەكار دەهێنێت ، بەڵام مەرج بۆ پێدانی پرۆكسی نیە. |
| 408 | **Request Timeout** | كات تەواودەبێت كاتێك كلاێنت لەسەر هۆست بەبێ كار دەمێنێتەوە ، یاخود كاتی دیاریكراو تێدەپەڕێنێت ، بۆ ووینە كاتی دیاریكراو لەسەر هۆستەكانی بواری بازرگانی ، ئەمە بۆ پاراستنە. |
| 409 | **Conflict** | --- |
| 410 | **Gone** | ڕاگەیەنراوە تەواوە و بەجێیە ، ڕاگەیەنراوەی دیوی سێرڤەریش بەهەمان شێوە ، بەڵام لەكاتی تەماشاكردنی هۆستەكەدا ، كردارێكی لەپڕ ڕوودەدات ئەویش هەڵەی **410**یە ، كە لەو كاتەدا دیوی سێرڤەر چیتر ئەو پەڕگەیە بەكار ناباتەوە ، وە یاخود دەی سڕێتەوە ، لەو كاتەدا ئەم جۆرە هەڵەیە نیشان دەدات ، حاڵەتێكی لەناكاوە و دەگمەنە. |
| 411 | **Length Required** | --- |
| 412 | **Precondition Failed** | سێرڤەر داواكاری جێبەجێ ناكات ، بەڵام وەڵامدانەوە دەدات لەسەر داواكاریەكانی خۆی. |
| 413 | **Request Entity Too Large** | داواكاری زۆرتر ، گەورەترە لە داواكراو ، واتە دیوی سێرڤەر. |
| 414 | **Request_URI Too Long** | --- |
| 415 | **Unsupported Media Type** | چەند جۆرێكی میدیای هەن كە سێرڤەر سەپۆرتی ناكات. |
| 416 | **Requested Range Not Satisfiable** | كلاێنت پرسیار دەكات لە جۆرە خزمەتگوزاریەك بۆ وەڵامدانەوە ، بەڵام ئەو خزمەتگوزاریە لەنێوەندی فایلەكاندا نیە. |
| 417 | **Expectation Failed** | --- |
| 418 | **Expectation Failed** | --- |
| 419 | **Authentication Timeout** | بەشێوەیەكی تایبەتی كۆدی **401** بەكار دەباتەوە بۆ كارەكانی ، ئەمەش مەرجی هەیە ، بۆ ووێنە ئەگەر كلاێنت كار بە پرۆتۆكۆڵی **HTTP** بكات ، بەڵام ئەگەر وانەبوو |

| | | |
|---|---|---|
| | | واتە لەسەر پرۆتۆکۆلکی دیکەی بەدەر لە HTTP بوو ئەوا 419 کارا دەبێت ، کە دەردەچیت لەکاتی خۆی ، وە ئەمەش مانای وایە HTTP 419 بەکار نابات مەگەر پێویست بکات. |
| 420 | Method Failure | بەهەمان شیوە ئەم کۆدەش پرۆتۆکۆلی HTTP بەکار نابات ، بەلاّم ئەم حالّەتە کاتێك روو دەدات کە میتۆدەکانی وەلاّمدەرەوە هەموو بکەونە هەلّەوە ، لەسەر دیوی کلاّینت ، بۆ ووێنە ئەپلّیکەیشنەکانی Spring Framework. |
| 422 | Unprocessable Entity | وەلاّمدانەوە لێرەدا پێکهاتەیەکە کە دارێژەر درووستی کردووە ، دەبیت کلاّینت بەپێی رێنمایی بڕوات ، ئەگەرنا هەلّە لە رستەکاندا روودەدات ، هەرکات هەلّە روویدا لەم کاتەدا 422 کارایە. |
| 423 | Locked | سەرچاوەکان ، وەلاّمدانەوەکان بەستراون (قفلّن) یاخود (قوفلّە). |
| 424 | Failed Dependency | --- |
| 426 | Upgrade Required | دیوی کلاّینت دەیەوێت پرۆتۆکۆلّێکی جیاواز بەکار بهێنێت ، بۆ ووێنە TLS..هتد |
| 428 | Precondition Required | سێرڤەر مەرج بۆ کلاّینت دادەنێت. |
| 431 | Request Header Fields Too Large | سێرڤەر ئامادە نیە وەلاّم بنێرێت ، لەبەر ئەوەی داواکاری نابەجێیە یان داواکاری دوور و درێژە. |
| 440 | Login Timeout (Microsoft) | لەسەر کۆمپانیای مایکرۆسۆفت دامەزراوە ، هەلّەکە نیشانی دەدات لەو رێرەوەدا کلاّینت کاری نەماوە. |
| 444 | No Response (Nginx) | کۆمپانیای Niginx بەکار دەبات بۆ چاودێریکردنی سەردانکەران ، ئەم کۆمپانیایە هەلّدەستیت بەپێدانی پرۆکسی هەرەمەکی ، ئەگەر هەلّەیەك روو بدات راستەوخۆ کلاّینت توانای بەکارهێنان لەدەستدەدات. |
| 449 | Retry With (Microsoft) | --- |
| 450 | Blocked by Windows Parental Controls (Microsoft) | --- |
| 451 | Unavailable For Legal Reasons (Internet draft) | هەلّەیەکی گرنگە ، تۆری جالّجالّۆکەیی ئینتەرنێت بەکاردەبات بۆ هەژمارکردن ، هەلەکە روودەدات کاتێك لەنێو ناوچەیەك لەرێگەی ووێب سێرڤەرەکانەوە هۆستێك یاخود سەرچاوەیەکی پێدەر بەتەواوەتی لەکار دەخەن ، ئەمەش لایەنی سیاسی و ئابوری و ..هتد دەگرێتەوە ، بەمەبەستی پاراستنی گشتی.<br>451 بەهەمانشیوە لەسەر مایکرۆسۆفتیش هەیە ، بەلاّم بەشێوەی گەڕاندنەوەی خۆکار |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەژماری دەکات. |
| 494 | **Request Header Too Large (Nginx)** | --- |
| 945 | **Cert Error (Nginx)** | ئەم کۆمپانیایە هەڵدەستێت بەپێدانی هەڵە کاتێك **SSL** لەهەمبەر کلاینت تووشی هەڵە دەبێت ، ئەم بارە جێگیرە لەسەر هەموو هەڵەکانی **4xx** ، بەمەبرجێ ئەگەر خاوەن سێرڤەرەکە لەم کۆمپانیایە پشکی وەرگرتبێت. |
| 496 | **No Cert (Nginx)** | وەك **495** بەڵام لێرەدە جۆری هەڵە دەستنیشان ناکات. |
| 497 | **HTTP to HTTPS (Nginx)** | گەڕانەوەی خۆکار بەکار دەبات بۆ ئەگەر هەڵەکە لەسەر **HTTP** بوو ئەوکات دەیگوێزێتەوە بۆ **HTTPS** ، لێرەدا هەڵەکان یاسان بۆ دارێژراوە. |
| 498 | **Token expired/invalid (Esri)** | --- |
| 499 | **Client Closed Request (Nginx)** | --- |

HostGator.com
Website Hosting

ERROR 404 - PAGE NOT FOUND

Why am I seeing this page?
How to find the correct spelling and folder
404 Errors After Clicking WordPress Links
How to modify your .htaccess file

***This site is hosted by HostGator!***
*Build your website today and get 20% off! Coupon code: "OFFER404"*
***CLICK HERE TO GET STARTED***

5. هەڵەکانی سەر دیوی سێرڤەر (**Server Error**) ، ئەم هەڵانە کاتێك ڕوودەدەن کە کێشە و هەڵە لەسەر وێب سێرڤەرەکاندا هەبێت ، هەرکاتێك هەڵەی ژمارەیی لەسەرەتاوە **5** بوو ، هەڵە لەدیوی سێرڤەردایە ، ئەم هەڵانەش هیچ لەتواناو دەسەڵاتی کلاینتدا نیە و بەو چارەسەر نابێت.

Server Error

**500 - Internal server error.**

There is a problem with the resource you are looking for, and it cannot be displayed.

ژمارەی دەستپێکی ئەم هەڵانەش لە **5xx**دان:

| **5xx Server Error** | | |
|---|---|---|
| ژ | ناونیشان | کورتەی ژمارە گرنگەکان |
| 500 | **Internal Server Error** | ئەم هەڵەیە کاتێك ڕوو دەدات کە هەڵەیەکی لەناکاو و چاوەڕوان نەکراو ڕوو لەسێرڤەردەکات ، بۆ وونە هەڵەیەك لە ئەپلیکەیشنەکان ، یاساکان ، وە ئەم هەڵەیە هیچ پەیوەندی بە داڕشتنی کۆدەوە نیە. |
| 501 | **Not Implemented** | لێرەدا سێرڤەر داواکاری ناناسێتەوە ، یاخود توانای جێبەجێکردنی داواکاریەکەی نیە. |
| 502 | **Bad Gateway** | هەڵەیەکی گرنگە ، کاتێك ڕوودەدات کە بەکاربەر ، یاخود سێرڤەرەکە ڕێگەی لاواز و هەڵەی ئەژمارکردووە ، جا ئەو ڕێگەی لاوازە بەهۆی ڕێنیشاندەر یاخود (**Gateway**)دەستنیشان دەکات بۆ ئاڵوگۆڕکردنی داتا و زانیاری ، یاخود پاکێجەکانی ناردن و وەرگرتن. بۆ ئەو مەبەستە هەڵەکە ڕاستەوخۆ پیشان نادرێت ، دەست دەکات بە بەکارهێنانی پرۆکسی ، بەڵام ئەگەر ئەوەش تێیدا هەڵە بوو ، ئەوکات **502** کارا دەبێتن. |
| 503 | **Service Unavailable** | سێرڤەر ناچالاکە. |
| 504 | **Gateway Timeout** | سەیری **502** بکە ، بەڵام لێرەدا پرۆکسی یاخود **gateway** وادەی مانەوەی وەرگرەکانی نیە و لەدەستی داوە. |
| 505 | **HTTP Version Not Supported** | سێرڤەر لەم بارە هەڵەیەدا پرۆتۆکۆڵی **htpp** بەکار ناباتن. |
| 506 | **Variant Also Negotiates** | --- |

| | | |
|---|---|---|
| 507 | Insufficient Storage | سێرڤەر لەسەر سندوقەو تۆمارکراوەکانی حازرکراوە ، بەڵام تەواو نەکراوە و لەکاردا نیە. |
| 508 | Loop Detected | سێرڤەر لەباری پشکنین دایە بۆ کارەکانی بەشێوی بەردەوام ڕێکخستن دەکات تا کاتی جێبەجێکردن و کاراکردن. |
| 509 | Bandwidth Limit Exceeded (Apache bw/limited (extension) | ئەم هەڵەیە لەباردا نیە بۆ خزمەتگوزاری RFCیەکان. |
| 510 | Not Extended | --- |
| 511 | Network Authentication Required | پێویستە لێرەدا دووبارە سێرڤەر بچێتەوە سەر کارپێکراوەکانی بواری تۆڕەکەی ، چونکە تووشی کێشە بووە. |
| 520 | Origin Error (CloudFlare) | ئەم هەڵەیە لەسەر هەموو خزمەتگوزاریەکانی RFC کارایە و بێ کێشە هەڵەکە ڕادەگەیەنێت ، بەڵام CloudFlare بەکاری دەبات ، هەڵەکەش ئەوکاتە روو دەدات کە پرۆسی بەکار دێت ، پێدەر نەناسراوە لەنێوان ڕاپۆرتەکانی پەیوەندی دوانەیی لەنێوان CloudFlare و نێتۆرك ئەکسسدا. |
| 521 | Web server is down (CloudFlare) | کاتێك سێرڤەر لەکاردا نامێنێت ، CloudFlare بۆ ئەوەی ڕاگەیەنراوێکی هەبێت 521 بەکار دەباتن ، ئەم ڕاگەیەنراوە لەسەر CloudFlare جێگیرە ، بەڵام هەموو خزمەتگوزاریەکانی RFC بەکاردەبات بۆ پشتڕاستکردنەوەی جۆری هەڵەکە. |
| 522 | Connection timed out (CloudFlare) | سەیری 502 و 504 بکە ، جیاوازیەکە 522 CloudFlare بەکار دەباتن ، لێرەدا هیچ پەیوەندیەك بە RFC نامێنێت. |
| 523 | Proxy Declined Request (CloudFlare) | لێرەدا سێرڤەر هیچ پەیوەندیەکی بە RFC یەوە نامێنێت ، بەڵام CloudFlare بۆ ئەوەی کێشەکە چارەسەر بکات پرۆکسی بەکاردەهێنێت ، ئەگەر ئەوەش وەستا و نەما ئەوکات کۆدی هەڵەکە دیاری دەکات کە 523یە. |
| 524 | A timeout occurred (CloudFlare) | بێشك کاتێك باس لە CloudFlare دەکەین مەبەستمان خزمەتگوزاری نوێی بواری خۆپارستنە بۆ هۆستەکان ، لەم هەڵەیەدا CloudFlare پرۆسی خۆی بەکاردەبات بۆ گەڕاندنەوە و ڕێگرتن لەهەڵەکانی خزمەتگوزاری RFC ، کە بریتین لە جۆری هەریەك لەو هەڵانەی باسکران ، ئەگەر هیچ شتێك وەك خۆی نەمایەوە ، کات دادەنێت بۆ چارەسەرکردن ، ئەم کاتە بۆ پشکنینە تا لێیەوە دەرچەیەك بدۆزێتەوە بۆ دەرچوون لەهەڵەکە ، بەڵام ئەگەر پێی چارەسەر نەکرا ،ئەوا 524 نیشان دەدات. |
| 598 | Network read timeout error | ئەم هەڵەیە پرۆکسی مایکرۆسۆفت لەسەر پرۆتۆکۆڵی http بەکار دەبات. کە دەڵێ هەڵەکە نەناسراوە ، مەبەست لێی هەڵەکە تایبەتیە و لەلایەن یەك کۆمپانیاوە دەردەچێت |

| | | |
|---|---|---|
| | (**Unknown**) | وه گشتی نیه واته لەسەر خزمەتگوزاریەکانی پێدراوی **RFC** نین ، لێرەدا وادەی مانەوە پەیوەندیەکە دیاری دەکات ، کە پەیوەندیەکی تایبەتیە و پرۆکسی بەکار دەبات. |
| **599** | **Network Connected read timeout error** (**Unknown**) | سەیری **598** بکە ، وادەی مانەوە هەڵەکە دەستنیشان ناکات بەڵکو هەڵەکە لە جۆر و شیوازی بەستنەکەدایە. |

وێنەی هەندێك لەو هەڵانە:

facebook

Sorry, something went wrong.

We're working on getting this fixed as soon as we can.

Go Back

Facebook © 2013 · Help

Google Error

We're sorry...

... but your query looks similar to automated requests from a computer virus or spyware application. To protect our users, we can't process your request right now.

We'll restore your access as quickly as possible, so try again soon. In the meantime, if you suspect that your computer or network has been infected, you might want to run a virus checker or spyware remover to make sure that your systems are free of viruses and other spurious software.

We apologize for the inconvenience, and hope we'll see you again on Google.

# Internal Server Error

The server encountered an internal error or misconfiguration and was unable to complete your request.

Please contact the server administrator, webmaster@mysite.com and inform them of the time the error occurred, and anything you might have done that may have caused the error.

More information about this error may be available in the server error log.

Additionally, a 404 Not Found error was encountered while trying to use an ErrorDocument to handle the request.

---

*Apache/2.2.22 (Unix) mod_ssl/2.2.22 OpenSSL/0.9.8e-fips-rhel5 mod_auth_passthrough/2.1 mod_bwlimited/1.4 FrontPage/5.0.2.2635 PHP/5.3.13 Server at www.mysite.com Port 80*

ووێنەی ڕێکخستنی هەڵەکان لەنێو **iis**دا ، لەسەر وویندۆز:




## تۆمارکراوەکان **Logging**

ئەپڵیکەیشنێکی دیکە بۆ مەبەستی چاودێریکردن ووەبەرهات ، گرنگی ئەم بەشە لەوەدایە کە لەتوانایدا هەیە ، بە هەموو تایبەتمەندیەکی ووردەوە بەیانی هەموو ڕاگەیەنراوە هاتوو ڕۆشتووەکان بکات بەهۆی دانانی چەند یاسایەك لەکاتی دارشتن.

هەموو ویب سێرڤەرێك دەبێت کرداری **Logging** بکات ، جا ئەو کردارەش بەچەند شێوەیەك دەبێت ، یان لەناو خودی ووێب سێرڤەرەکە ئەپڵیکەیشنێك ئەو کارە دەکات و خۆییە ، یان دارێژەر بە بەکارهێنانی بەرنامەیەکی دەرەکی ئەو کارە دەکاتن.

**Web Access Log Viewer** help [view]

Refresh

**Filter results:**

| Date: | | | |
|---|---|---|---|
| From (MM/DD/YYYY): | | To (MM/DD/YYYY): | |
| Ignore Dates: | ☐ | | |
| **Identity:** | | | |
| Remote Address: | | Authenticated User: | |
| **Request:** | | | |
| Request Method: | ANY | Requested URI: | |
| **Result Size:** | | | |
| Start Result: | | Max Results: | 10 |

Go

**Found 10 matches in logfile (76 lines searched).**

1 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/ HTTP/1.1" 302 -
2 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/portal/welcome HTTP/1.1" 200 6174
3 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/main.css HTTP/1.1" 200 8694
4 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/favicon.ico HTTP/1.1" 200 3638
5 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/images/login_lock_64x55.gif HTTP/1.1" 200 2637
6 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/images/head_bgstretch_1x86.gif HTTP/1.1" 200 281
7 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:00 -0500] "GET /console/images/head_left_login_586x86.gif HTTP/1.1" 200 12422
8 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:07 -0500] "POST /console/portal/j_security_check HTTP/1.1" 302 -
9 127.0.0.1 - system [21/Feb/2007:13:47:10 -0500] "GET /console/js/forms.js HTTP/1.1" 200 3795
10 127.0.0.1 - - [21/Feb/2007:13:47:10 -0500] "GET /dojo/dojo.js HTTP/1.1" 200 150002

کارەکانی ئەم ئەپڵیکەیشنە لەنێو ووێب سێرڤەرەکاندا بەم شێوەیە دەبێت:

- گرنگ ترین کار بۆ لۆگ کردن ، یاخود تۆمارکردنی هەموو ئەو ڕووداوانەیە کە لەنێو (هۆست – سێرڤەر) ڕوو دەدات.
- کات و بەروار: لێرەدا کات و بەروار بۆ دەستنیشانکردنی کاتی لۆگکردنە ، واتە لەکامە کات و بەروار تۆمارکراوەکان نیشان بدات. (کاتی پیشاندانەوە).
- قەبارە: پاڵاوتەی قەبارە بۆ فایلە تۆمارکراوەکان بەپێی قەبارەکانیان ریك بخات. (پیشاندانەوە و تۆمارکردن)
- **Encoding**: زۆرێك لە لۆگ فایلەکان بەشێوە زمانی جودا تۆمار دەکرێت ، لێرەدا جۆرێتی شێوازی زمان دەستنیشان دەکرێت. (تۆمارکردن)
- تۆمارکردن بەپێی کات و بەرواری دیاریکراو. (تۆمارکردن)
- شوێن ، شوێنی تۆمارکراوەکان لەکوێ ڕابێت. (پیشاندانەوە و تۆمارکردن)

- جۆر ـ**Format**ـ ، جۆری تۆمارکراوەکان بەپێی لقبەندکردن و پەیوەندی گرتن دەگۆڕێت ، بۆ ووێنە (لۆکاڵی و گڵۆباڵ) ، ئەوانیش چەند جۆرێکی دیکەن. (تۆمارکردن)
- هەڵبژاردنی نەخشەی تۆمارکراوە: ئەم کارەی گرنگە و دەیەوێت بەکارهێنەر کامە زانیاری تۆمار بکات لەسەر فایلەکانی ، کردارەکان زۆرن ، بۆ ووێنە:

**Client IP, Date & Time, Server IP, Server Port, Cookies, User Name, Refer...Etc** (تۆمارکردن و پیشاندانەوە)

وە چەند کارێکی تر.

## Common Gateway Interface ـ CGI

ئەپڵیکەیشنێکی دیکەی ووێب سێرڤەر دامەزراوە و هەمیشە جێگیرە **CGI**یە ، کە تێکڕای کارەکانی بە سکریپت دەکات **Script Alias** ، سکریپتەکانی زۆرن لەم بابەتە نامەوێت بەشیوەکی زۆر زانستیانە باس لەم ئەپڵیکەیشنە بکەم ، بەهەرحاڵ **CGI** ڕێڕە و ڕێچکەی ووێب سێرڤەرە ، بەشێوەی کردەیی ناو خۆ ، واتە لەنێوەندی سێرڤەر وەگەڕخەرێکە و بۆ کۆنفیگەری سێرڤەرەکە کاردەکات ، فایلەکان دەناسێتەوە و دەست دەگرێت بەسەر هەموو بەشەکانیدا ، بۆ ووێنە لێرەوە دەتوانین ڕێڕەوێك چمود **chmod** بکەین بە هەموو پێکهاتەکانی سکریپتەکە ، دەتوانین کۆنسوڵی نوێ دابمەزرێنین و کاریان پێ بکەین ، لەخوارەوە گرنگترین کارەکانی **CGI** دەناسێنین.

- **Forbidden**: ئەو ڕێڕەوانە دەگونجێنیت کە لەناو سێرڤەرەکەدان ، بۆ ووێنە پێرمیژن ، هەڵەکانی ڕێڕەو..هتد.
- هەڵە ناوخۆییەکانی سێرڤەر (**Internal Server Error**) ، پێشتر لە کۆدی هەڵەکان دواین ، لە **CGI**دا ئەو هەڵانە ڕێك دەخرێت کە لەچ کاتێك و لە چ بەروارێك و چۆن ئەو هەڵانە لۆگ بکرێن.
- **File permissions** ، ئەم تایبەتمەندیە گرنگە و لێرەدا ئەپڵیکەیشنەکە هەڵدەستێت بە پێدانی (نرخ – **Value**) بۆ ڕێگەپێدراوە و ڕێگە پێ نەدراوەی فایلەکان لەناوخۆی سێرڤەردا ، ئەوانیش چەند نرخێکن:

**r,w,x**

واتە (**Read, Write, Execute**)

هەریەك لەو سێ نرخە بە سێ ژمارەی دەستنیشانکراو دەستپێ دەکات:

**000**

ئەم سێ ژمارەیە ئاڵوگۆڕ دەکەن و هەریەك بەرزترین نرخی پێ دەدرێت کە ژمارە (**7**)ە.

ژمارەکانی یەکەم (**Owner permissions**)

ژمارەکانی دووەم (**Group permissions**)

ژمارەکانی سێهەم (**Public permissions**)

ئەگەر نرخی یەکەم 7 بێت و نرخی دووەم 7 و نرخی سێهەم 5 بێت ئەوا بەم شێوەیە گۆ دەکرێت (755) ، کە مەبەست لێی:

**Owner:**

**Read (+) Write (+) Execute (+) = (rwxr) = 111 = (7)**

**Group:**

**Read (+) Write (_) Execute (+) = (xr) = 101 = (5)**

**Public:**

**Read (+) Write (_) Execute (+) = (x) = 101 = (5)**

**= 755 = (rwxr_xr_x)**

**Command: chmod 755 (rwxr_xr_x)**

| Octal | Decimal | Permission | Representation |
|---|---|---|---|
| 000 | 0 (0+0+0) | No Permission | --- |
| 001 | 1 (0+0+1) | Execute | --x |
| 010 | 2 (0+2+0) | Write | -w- |
| 011 | 3 (0+2+1) | Write + Execute | -wx |
| 100 | 4 (4+0+0) | Read | r-- |
| 101 | 5 (4+0+1) | Read + Execute | r-x |
| 110 | 6 (4+2+0) | Read + Write | rw- |
| 111 | 7 (4+2+1) | Read + Write + Execute | rwx |

- دەستنیشانکردنی ڕێڕەو (**Path information and environment**) و زیاد و کەمکردنی.
- هەڵەکانی ئەپڵیکەیشن و پلاتفۆرمەکان (**Error Log, Program Error**)
- نیشاندانی تۆمارکراوەکان و چاودێریکردنی هەڵەکانی سێرڤەر (**Server Error**)

وە زۆرێکی دیکە.

---

چەند ئەپڵیکەیشن و پلاتفۆرمێکی دیکە هەن کە کاری لەمێژیان هەیە و نەوەی گرنگیان هەیە و کۆنن بۆ وێنە (**web configuration manager**) کەخۆدان لەقەرەی باسکردنەکەی پەرتوکێك هەڵدەگرێت ، بەڵام لێرەدا ئەوەندە بەسە و نامانەوێت ئەوەندە لەبابەت دوور بکەوینەوە ، بۆیە ئەوانەشمان بەنموونە هێنایەوە تاوەکو لەکارەکانی (فیلتەرینگ ، لۆگین ، هەڵەکان و ڕاگەیەنراوەوە ..هتد) کەمێك شارەزایمان هەبێت ئەوکات بچینە سەر فایلە نوێیەکە **htaccess** و گرنگی فایلەکە دەربخەین.

بەهەرحاڵ ، لێرەوە دەست دەکەین بە شیکردنەوەی فایلی **htaccess** و ناوەڕۆك و سکریپتەکانی باس دەکەین...

پێناسەیەکی کورتی فایلەکە

فایلی **htaccess.** کە کورتکراوەیە و درێژکراوەکەی (**hypertext access**)ە ، فایلێکە بۆ کۆنفیگەرکردنی ڕێڕەوە ئاست بەرزەکان دروستکراوە لەناو وویب سێرڤەری **Apache**دا (**Directory_Level Configuration**) ، بەشێوەیەکی گشتی ئەم فایلە کاری بەڕێوەبردنی کردارە خۆیی (**Default**)ەکانە لەسەر دایرێکتەریەکانی ناو سێرڤەرەکە. بەشێوەیەکی گشتی فایلەکە بۆ دوو مەبەست دروستکراوە (**لایەنی پارێزگاری ، کات**).

چالاك کردنی فایلەکە

بەشێوەیەکی ئاسایی خۆشبەختانە لەناو هەموو هۆستێکی سەربە وویب سێرڤەری ئەپاچیدا ئەم فایلە هەیە و چالاککراوە ، بەڵام لەهەندێك وویب سێرڤەردا کۆنفیگەر کراوە لەلایەن کۆمپانیای پێدەر ، یاخود **Web Host Company** ، واتە ئەو شوێنەی هۆستەکەت لێ کڕیوە ، لەوێ ناچالا کراوە ، هەندێك لەو کۆمپانیایانە بەپارە ئەو فایلە چالاك دەکەن و زۆرێکیش بەبەلاش دەیدەنە بەکاربەرانیان و لە زۆر حاڵەتیشدا فایلەکە خۆکارە ئەگەرچی تۆ هۆستێکی فریش بگریت.

بەڵام لەسەر وویب سێرڤەری ویندۆز ، کە خۆکارانە **iis** بەکاردەبات ، لەوێدا دەتوانین بەهەمان شێوە پلاتفۆڕمی (**URL Rewrite**) بەکاربخەین.

پلاتفۆڕمی **URL Rewrite**

یەکێکە لەو پلاتفۆڕمانەی کاری سەرەکی لەسەر ڕێڕەوەکان دەکات بریتیە لە **URL Rewrite** کە هاوشێوەی فایلی **htaccess** گرنگترین کاری ئەوەیە یاسای فەرمانداری دابنێت بۆ ڕێڕەوەکان لەسەر دوو بنچینە (ڕێگەپێدراو ، ڕێگەپێنەدراو).

دەتوانین لەبەشی خوارەوەی بەرنامەکە ئەو پلاتفۆڕمە چالاك بکەین ، کرتە لە ( **Web Platform Installer**) بکە:




پاشان بگەڕێ بەدوای (**URL Rewrite**)دا و داونلۆد و ئینستاڵی بکە:




فایلەکە چۆن دەناسرێتەوە؟

فایلەکە پاشگری نیە ، وەك سندوقێك وایە بۆ تۆمارکردن ، بەڵام ئەوە نابێتە ئەوەی بڵێین بەپەنهانی فایلی **htaccess** بێ پاشگرە ، ئەم جۆرە فایلانە بانگ دەکرێن بە (**flat file**) ، بەهەرحاڵ **dot** یاخود **.htaccess** لەپێش ناوی فایلەکەیەو نەگۆڕە ، لەناو فایلەکەشدا نیشانەی **#** بۆ نووسینی کۆمێنت

لەپێش سکریپتەکان هەیە. بیرمان نەچێت ئێمە باسی وویب سێرڤەر دەکەین باسی سکریپت ناکەین ، چونکە لە زۆربەی سکریپتەکان پاشگری فایلەکە دەگۆڕێت ، گەشەپێدەرانی سکریپتەکە بۆ ئاسانکاری ئەو پاشگرانە بەئارەزوومەندانە دەگۆڕن ، بۆ ووێنە **txt**.

بەکارهێنانی فایلەکە

جۆری فایلەکە دامەزراوە لەسەر کۆنفیگەرکردنی وویب هۆستەکە ، بەکارهێنانیشی ڕێك هاوپێچ و سنووردارە بەو وویب سێرڤەرەی (هۆستەکان/هۆست)ی لەسەر دامەزراوە ، ئەم فایلە لەچەند ڕوویەکەوە بەکار دەهێنرێت:

- فەرماندەیی (**Authorization**) ، لەم ڕووەوە بەکارهێنانی فایلەکە **access** بەکاردەبات بۆ هابەشی پێکردن و بەڕێوەبەرایەتی فەرمانەکانی (ڕێڕەوکاری ـ**direction**ـ ، بەکاربەری نادیار ، پاسۆردەکانیان ، **IP**یەکانیان..هتد).



- نووسەرەوە (**Rewriting**) ، مەبەست لەم بەکارهێنە نووسینەوەی (تۆمارکراوەکان ـ**logs**ـ)ە کە سێرڤەر لەسەر ئەم فایلە بەکاری دەهێنێت ، هەروەها نووسەرەوە گرنگی دەدات بە کورتکردنەوەی **URL** بۆ ووێنە:

**https://www.facebook.com/profile.php?id=4**

**To:**

**https://www.facebook.com/zuck**

یاخود:

**https://www.developer.facebook.com**

**http://[1.2.3.4.5.6.7.8.9].example.com > Rewriting**

- **Blocking** ، کاری بلۆك کردن لەسەر دوو بنەما پێ دەکەوێت (ڕێگەپێدراوە و ڕێگەپێنەدراوە) – (**Allow** / **Deny**) ، مەبەست لەوە قوفڵدان یاخود دانانی یاسایەکە بۆ

بەکارهێنەر ، دیوی کلاینت کاتێك سەرچاوەیەك دەکەنەوە ، بۆ نموونە ڕێگەنەدان بە چەند **IP**یەك یاخود تاکە **IP**یەك ، بلۆك کردنی **IP** شارێك ، وولاتێك..هتد.

لەداهاتوودا نموونەکان بەباشی ڕووتدەکەینەوە...




سەیری هەڵەی دیوی کلاینت ، ژمارە **403** بکە.

- چالاککردنی **SSL** ، بەکارهێنانێکی دیکەی فایلی **htaccess**. چالاککردنی ( **Server Side Includes**)ە ، بۆ ڕێبەر و ڕێکارێکی دیاریکراو ، ئەم چالاککردنە لەکاتێکدا بەجێ دەگات کە فەرمانەکانی **SSL** لەناو فایلەکە جێگیر کرابێت.

## **SSL** چیە؟

فەرمانێکی ناوخۆیی سێرڤەرە لەسەر فایلی **html** یاخود ئەو فایلەی بۆی دیاری دەکرێت ، فەرمانەکانی هەندێك لە ئەپڵیکەیشنەکان ڕادەگەیەنێت بە سکریپت ، واتە دەکەوێتە نێو دەروازەی ( **server_side scripting**)ەوە ، بەشێوەیەکی خۆکارانە پاشگر بەم شێوەیە دەبێت (**shtm , stm, shtml**) ، زۆرێك لەو ڕاگەیەنراوانە دەربارەی پەیوەندیەکانی سێرڤەر و کلاینت **SSL** جێبەجێی دەکاتن ، بۆ ووێنە (**exec**) یاخود کردارەکانی (**CMD**) لەناو ووێب وە هەتا دوایی.

```
<!DOCTYPE html PUBLIC "-//W3C//DTD HTML 4.01//EN"
   "http://www.w3.org/TR/html4/strict.dtd">
<html lang="en">
<head>
        <title>Server Side Includes</title>
</head>

<body>
        <!--#include virtual="includes/header.shtml" -->
        <!--#include virtual="includes/topnav.shtml" -->

        <div id="main">
                <p>text text</p>
        </div>
        <!--#include virtual="includes/footer.shtml" -->
</div>
</body>
</html>
```

- بەڕێوەبەردنی پرۆگرام و سکریپتە جێبەجێکاریەکانی (**CGI**) ، **ExecCGI** ، **fastcgi** ، **cgi_script** ، سەیری **CGI _ Common Gateway Interface** بکە.

```
# disable directory browsing

        Options ExecCGI Includes IncludesNOEXEC SymLinksIfOwnerMatch -Indexes

        # enable directory browsing
        Options All +Indexes
```

- نیشاندەری ڕێگەچارە (**Troubleshooting**) ، کاتێك فەرمانەکانی کۆنفیگەرکردن لەناو فایلی **htaccess** بەجێ دەگەیەنیت ، وە ئەگەر بێت و ئەو فەرمانانە نابەجێ و ناپەسەند و نەناسراو بوون لەتەك سکریپتەکانیدا ، ئەوا بەشێوەیەکی خۆکارانە ، یاخود بەهۆی سێنتاکسێك چارەسەری کێشەکە و ڕێگەچارە دەدۆزێتەوە بۆ کێشەکە ، ئەگەر کێشەکەش لەدەرەوەی فایلەکەبێت ، سکریپتی (**AllowOverride**) دادەڕێژرێت لەنێوەندی سێنتاکسەکەدا ، هەرکات هاوشێوەی سکریپتەکە نووسرا فەرمانی نیشاندەری ڕێگەچارە هەڵدەستێت بەکۆکردنەوە و ڕیزکردنی هەموو هەڵە و چارەسەرەکان لەناو تۆمارکراوەکاندا **logfiles**.

- لیستی دیاری نەکراوەکان (**Directory listing**) ، ئەم کارەی فایلەکە گرنگە چونکە کاتێك هیچ شتێك یاخود هیچ یاسایەك بۆ پەڕگە و ڕێڕەوەکان دانەنراوە ، لێرەدا بەسکریپت ڕای دەگەیەنیت بۆ ئەوانە چی پیشان بدات و چی فەرمانێك بەجێ بگەیەنێت ، بۆ نموونە پەڕگەی هەڵەکان.

- **Cache Control** ، مەبەست لە بەڕێوەبردنی ئەو ڕێڕەو و فایلە زۆر بەکارهاتووانەیە لەسەر سەرچاوەیەك ، بۆ نموونە (کووکی ، **ip**) کلاینت ،تاوەکو لەڕێگەیەوە کاتی گەڕانەوە یاخود کاتی لۆدکردنی فایلەکە زوو بێتە بەردەست ئەگەر گۆڕانی تێدا نەکرابوو. بەنموونە کاتێك تۆ پەیجێك هەمیشە دەکەیتەوە.

- **Custom Error Pages** ، لێرەدا فایلەکە ڕێت پێدەدات کە کۆنترۆڵی هەرچی پەڕگە هەڵەدارەکان بکەیت ، بۆ نموونە:

**400 Bad Request**

**403  Forbidden**

**500 Internal Server Error**

### فەرمانەکانی **htaccess.**

فەرمانەکان زۆرو زەوەندەن ، کە لەنێوفایلەکە بەشێوەی سکریپت دادەڕێژرێت ، بۆ ئەو مەبەستانەی لای خوارەوە ، مەبەستەکان یاخود چەمکەکانیش زۆرن ، وە بۆ تێگەیشتن ئاسانن ، ئێمە نەمانتوانی ئەوەندە فەرمان شی بکەینەوە ، چونکە کاتێکی زۆری دەوێت ، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی پۆلێنکاری

دەکەین ، ئەم پۆلێنکاریە بۆ مەبەستی فەرمانە گرنگەکان دەکرێت و لەخوارەوە زۆربەی فەرمانەکان نووسراون.

- فەرمانەکانی (**File**) ، دەستگرتن بەسەر فایلاتی ناو وویێب سێرڤەرەکەدا.
- فەرمانەکانی (**location**) ، دەستگرتن بەسەر ڕێڕەوکاری **URL** و گونجاندنی ئاڕاستەکانیان بەهۆی تایبەتمەندیەوە.
- فەرمانەکانی (**Email**) ، بریتین لەو فەرمانانەی کە چاودێری هەرچی ووردەکاریەکی سەر سیستەمی کلاینت دەکات بۆ کار ئاسانی ، بۆ ووێنە (کووکیەکان).
- فەرمانەکانی (**Proxy**) ، لێرەدا پێدانی پرۆکسی و کات و وادەی دەستنیشانکراو دیاری دەکات ، وە هەڵەکان لێکدەداتەوە.
- فەرمانەکانی (**SSL**) ، سکریپتە هاوپێچکراوەکانی دەستنیشان دەکات بۆ ڕێبەریکردن.
- فەرمانەکانی (**Filtering**) ، پاڵاوتەکاری دەکات بۆ تۆمارکراوەکان.

وە هەتا دوایی ، لەخوارەوە ، فەرمانەکانی فایلەکە بەشیوەیەکی گشتی دەنووسین ، تۆ دەتوانی (دوو کرتە) لە فەرمانێك بکەیت بۆ هەڵبژاردن ، پاشان (کلیکی لای ڕاست) بکە و بچۆ سەر ( **Search google for ‘NAME’**) بۆئەوەی لەگووگڵ بەدوای ئەو ووشەیەدا بگەڕێت کە لەنێو لیستەکە هەڵتبژارد:

**Directory, DirectoryMatch, Files, FilesMatch, IfDefine, IfVersion, IfModule, Limit, LimitExcept, Location, LocationMatch, Proxy, ProxyMatch, VirtualHost, AcceptMutex, AcceptPathInfo, AccessFileName, Action, AddCharset, AddDefaultCharset, AddDescription, AddEncoding, AddHandler, AddInputFilter, AddLanguage, AddOutputFilter, AddOutputFilterByType, AddType, Alias, AliasMatch, AllowCONNECT, AllowOverride, Anonymous, Anonymous_Authoritative, Anonymous_LogEmail, Anonymous_MustGiveEmail, Anonymous_NoUserId, Anonymous_VerifyEmail, AuthAuthoritative, AuthDBMAuthoritative, AuthDBMGroupFile, AuthDBMType, AuthDBMUserFile, AuthDigestAlgorithm, AuthDigestDomain, AuthDigestFile, AuthDigestGroupFile, AuthDigestNcCheck, AuthDigestNonceFormat, AuthDigestNonceLifetime, AuthDigestQop, AuthDigestShmemSize, AuthGroupFile, AuthName, AuthType, AuthUserFile, BS2000Account, BrowserMatch, BrowserMatchNoCase, CacheNegotiatedDocs, CharsetDefault, CharsetOptions, CharsetSourceEnc, CheckSpelling, ContentDigest, CookieDomain, CookieExpires, CookieName, CookieStyle, CookieTracking, CoreDumpDirectory, DAV, DAVDepthInfinity, DAVMinTimeout, DefaultIcon, DefaultLanguage, DefaultType, DocumentRoot, ErrorDocument, ErrorLog, ExtFilterDefine, ExtFilterOptions, FancyIndexing, FileETag, ForceLanguagePriority, ForceType, GprofDir, Header, HeaderName, HostnameLookups, IdentityCheck, ImapBase, ImapDefault, ImapMenu, Include, IndexIgnore, LanguagePriority, LimitRequestBody, LimitRequestFields, LimitRequestFieldsize, LimitRequestLine, LimitXMLRequestBody, LockFile, LogLevel, MaxRequestsPerChild, MultiviewsMatch, NameVirtualHost, NoProxy, Options, PassEnv, PidFile, Port, ProxyBlock, ProxyDomain, ProxyErrorOverride, ProxyIOBufferSize, ProxyMaxForwards, ProxyPass, ProxyPassReverse, ProxyPreserveHost, ProxyReceiveBufferSize, ProxyRemote, ProxyRemoteMatch, ProxyRequests, ProxyTimeout, ProxyVia, RLimitCPU, RLimitMEM, RLimitNPROC, ReadmeName, Redirect, RedirectMatch, RedirectPermanent, RedirectTemp, RemoveCharset, RemoveEncoding, RemoveHandler, RemoveInputFilter, RemoveLanguage, RemoveOutputFilter, RemoveType, RequestHeader, Require, RewriteCond, RewriteRule, SSIEndTag, SSIErrorMsg, SSIStartTag, SSITimeFormat, SSIUndefinedEcho, Satisfy, ScoreBoardFile, Script, ScriptAlias, ScriptAliasMatch, ScriptInterpreterSource, ServerAdmin, ServerAlias, ServerName, ServerPath, ServerRoot, ServerSignature, ServerTokens, SetEnv, SetEnvIf, SetEnvIfNoCase, SetHandler, SetInputFilter, SetOutputFilter, Timeout, TypesConfig, UnsetEnv, UseCanonicalName, XBitHack, allow, deny, order, CGIMapExtension, EnableMMAP, ISAPIAppendLogToErrors, ISAPIAppendLogToQuery, ISAPICacheFile, ISAPIFakeAsync, ISAPILogNotSupported, ISAPIReadAheadBuffer, SSLLog, SSLLogLevel, MaxMemFree, ModMimeUsePathInfo, EnableSendfile, ProxyBadHeader, AllowEncodedSlashes, LimitInternalRecursion, EnableExceptionHook, TraceEnable, ProxyFtpDirCharset, AuthBasicAuthoritative, AuthBasicProvider, AuthDefaultAuthoritative, AuthDigestProvider, AuthLDAPAuthzEnabled,**

**AuthLDAPBindDN, AuthLDAPBindPassword, AuthLDAPCharsetConfig, AuthLDAPCompareDNOnServer, AuthLDAPDereferenceAliases, AuthLDAPGroupAttribute, AuthLDAPGroupAttributeIsDN, AuthLDAPRemoteUserIsDN, AuthLDAPURL, AuthzDBMAuthoritative, AuthzDBMType, AuthzDefaultAuthoritative, AuthzGroupFileAuthoritative, AuthzLDAPAuthoritative, AuthzOwnerAuthoritative, AuthzUserAuthoritative, BalancerMember, DAVGenericLockDB, FilterChain, FilterDeclare, FilterProtocol, FilterProvider, FilterTrace, IdentityCheckTimeout, IndexStyleSheet, ProxyPassReverseCookieDomain, ProxyPassReverseCookiePath, ProxySet, ProxyStatus, ThreadStackSize, AcceptFilter, Protocol, AuthDBDUserPWQuery, AuthDBDUserRealmQuery, UseCanonicalPhysicalPort, CheckCaseOnly, AuthLDAPRemoteUserAttribute, ProxyPassMatch, SSIAccessEnable, Substitute, ProxyPassInterpolateEnv**

## باشیەکانی فایلی **htaccess**

- هەموو ڕاگەیەنراوەکانی (**Requests**) دیوی کلاینت و سێرڤەرەکە دەخوێنێتەوە و شیکاری دەکات.
- بەکارهێنەرە (**User**) زیرەك و ئاژاوەچیەکان دەناسێتەوە.
- بەشێوەی تێکستی نەگۆڕ (سێنتاکس)ی نەگۆڕ ، کار دەکات ، واتە بەبێ بوونی میدیا.

## خراپیەکانی **htaccess**

- خێرایە بۆ دۆزینەوەی هەڵەکانی سەر وویب سێرڤەر. ئەمەش بۆ سێرڤەر باشە ، بەڵام بۆ بەکارهێنەران خراپە و لایەنی پارێزگاری لەدەست دەدات.
- خاوترە لە کردارەکانی دیکەی کۆنفیگەرکردنی وویب سێرڤەرەکە.
- لەهەموو پەڕەیەکدا ئامادەیە و لۆد دەخاتە سەر پەڕەکە.
- هەموو کاتێك گەڕان دەکات ، واتە کار دەکات ، جێگیر نیە.

## درووستکردنی فایلەکە و شوێنەکەی

فایلەکە بەشێوەیەکی ئاسان درووست دەکرێت ، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر بەشیوەی خودکارانە درووست نەکرابوو ، دەتوانی لە وویندۆزدا بە نۆتپیاد فایلەکە درووست بکەیت و خەزنی بکەیت بەبێ پاشگر ، واتە تەنها (**.htaccess**) بەم شێوەیە (**".htaccess"**) بەبێ کەوانەکە ، یاخود لە نێو تێرمیناڵ دەتوانین (**sudo nano /var/www/example.com/.htaccess**) بنووسین ، بێگومان بەڕێڕەو (شوێن)ی جیاواز ، ئێمە دەتوانین ڕێڕەوی جیاواز هەڵبژێرین بۆ تۆمارکردنی فایلەکە ، بۆ نموونە:

**/.htaccess**

**/www/.htaccess**

**/www/htdocs/.htaccess**

**/www/htdocs/example/.htaccess**

**/var/www/example/.htaccess**

یاخود لەنێو دایرێکتەری زۆربەی هۆستەکاندا جێگیرکراوە بەناوی (**public_html**).

چالاککردنی ڕێڕەوی فایلەکە بەم شێوەیە دەبێت لەناو فایلی (**httpd.conf**)دا لە سێرڤەری **apache**:

<Directory /var/www/example/>

**Options Indexes Includes FollowSymLinks MultiViews**

**AllowOverride AuthConfig**

**Order allow,deny**

**Allow from all**

<Directory/>

مەرج نیە ئەو تایبەتمەندکراوەی سەرەوە ، وەك خۆی بنووسیتەوە ، تۆ دەتوانی تایبەتمەندی زێدەتر وە کەمتر بدەیت بە ئەو ڕێڕەوەی کە فایلەکەی تێدا جێگیرە ، پاشان ڕێڕەوەکەش گۆڕانی بەسەردا دێت ، لای تۆ ئەگەری هەیە لەناو ڕێرەوی سەرەکیدا دابنێیت وەك

<Directory>

...Script

<Directory/>

بەهەر شێوەیەك بێت ، ئێمە لێرەدا تەنها دەمانەوێت دەرگاکەت بۆ بکەینەوە و تێ بگەیت کە چۆن فایلەکە چالاك دەکەیت لەناو سێرڤەرەکەت.

پاش ئەوە پێویستە سێرڤەرەکە ڕێستارت بکەینەوە ، ئەگەر **Fedora /Red Hat** لە لینۆکس بەکار دەبەیت ئەم کۆماندە بنووسە:

**# service httpd restart**

ئەگەر **Debian** بەکار دەبەیت ئەم کۆماندە بنووسە:

**# /etc/init.d/apache_perl restart**

یاخود بەشێوەی **GUI** لە ویندۆزدا ، ئەگەر **XAMPP** بەکاردێنیت:




ئەپاچی **Stop** بکە و پاشان **Start** بکەرەوە...

یاخود لەتێرمیناڵ بەم شێوەیە دەنووسرێت:

sudo apachectl restart

پاشان بۆ ئەوەی فایلەکە پارێزراوبێت پێویستە بەکاربەر و ووشەی تێپەڕمان هەبێت ، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە فایلی **htpasswd**. درووست بکەین و وەگەڕی بخەین.

**htpasswd**. چیە و چۆن درووست دەکریت

**Htpasswd** فایلێکە (**flat file**) بۆ تۆمارکردنی (بەکاربەر و ووشەی تێپەڕ) بەکاردێت لەناو ووێب سێرڤەری ئەپاچی ، کە پەیوەند دەکرێتەوە بە فایلی **htaccess** و ئەو فایلە دەپارێزێت لە مەترسیەکانی داخڵ بوون لەلایەن بەکارهێنەرانی دیکەی سەر سێرڤەرەکە ، تا نەتوانن گۆڕانکاریەکان ببینن وە دەستکاری بکەن ، پاسۆردەکەش بەشێوەی **SHA1** و **MD5** لە لینۆکسدا تۆماردەکات.

درووستکردنی فایلەکە

سەرەتا دەبێت ئەو شوێنەی کە فایلەکەی تێ دەکەین پێشتر دیاریمان کردبێت ، بۆ نموونە:
**/usr/local/apache/passwd**

پاشان بۆ درووستکردنی فایلەکە ئەم کۆماندە بنووسەرەوە:
**htpasswd -c /usr/local/apache/passwd/passwords example_user**

یاخود:
**htpasswd -c /usr/local/apache/passwd/.htpasswd example_user**

**example_user**: ناوی بەکاربەرەکەیە...
دوای ڕیستارتکردنەوە ، فایلی **htpasswd** داوا دەکات بەکاربەرەکە و ووشەی تێپەڕ دابنێین:

```
# htpasswd -c /usr/local/apache/passwd/passwords example_user
New password: example_password
Re-type new password: example_password
Adding password for user example_user
```

**example_password**: پاسۆرد (ووشەی تێپەڕ) داخڵ دەکەیت ، هێڵ بە هێڵ.

پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ناو فایلی **htaccess** بۆ ئەوەی پەیوەندیەکە درووست بکەین ، واتەکۆنفیگەر بکەین:

```
AuthType Basic
AuthName "Any_Name"
# (Following line optional)
```

**AuthBasicProvider file**

**AuthUserFile /usr/local/apache/passwd/passwords**

**Require user example_user**

تێبینی/ لەناو فایلی **htpasswd**دا پاسۆردەکان پارێزراون ، بۆ ووێنە ئەگەر پاسۆردەکەمان **example** بوو بەم شێویە دەردەچێت: (**XXUp2ozpdysrQ = example**)

بەشێوەیەکی خۆکارانە فایلەکە درووست دەبێت لەنێو دایرێکتەری (**/usr/local/apache2/bin/htpasswd**)دا.

پاشان دەچینە ناو فایلی **httpd.conf** و لەوێ ئەم گۆڕانکاریانە دەکەین:

**AuthType Basic**

**AuthName "Restricted Files"**

**# (Following line optional)**

**AuthBasicProvider file**

**AuthUserFile /usr/local/apache/passwd/passwords**

**Require user example_user**

لەهەنگاوی داهاتوودا پێویستە ئەو شووێنەی فایلەکەی تێدا جێگیرکراوە ڕێگەپێدراو بێت بۆ کردنەوە ، بۆ ئەو مەبەستەش دەچین لەناو فایلی **httpd.conf**دا دەگەڕێین بەدوای (**AllowOverride**) بەبێ کەوانەکە ، لەسەر ئەو ڕێڕەوەی فایلەکەی تێدا درووستکراوە پاشان ئەگەر (**None**) بوو دەیکەین بە (**All**) ، بەبێ کەوانەکە.

تێبینی/ بۆ ئەوەی کارەکە ئاسان بێت ، دارێژەران هەندێك پرۆگرامی سانا و تایبەتیان بەدرووستکردنی ئەم جۆرە فایلانە درووستکردووە ، لە گووگڵ بنووسە (**htpasswd generator**).

ئەگەر ووشەی نهێنیت نەدا بەفایلەکە ئەوا پێرمیژنەکەی بکە بە **644** یاخود (**--RW-R--R**).

ئەو پرۆگرامانەی لەگەڵ ئەپاچیدا کاردەکەن

چەند پرۆگرامێك هەن کە هاوبەشی لەگەڵ فایلی **htaccess**دا دەکەن بۆ ڕاپی کردنی کارەکانی و ئاسان بەکارهێنانی ، هەریەك لەو پرۆگرامانەش کاری جودا دەدەن بەفایلەکە ، هەندێك لەوان کارەگە بەنهێنی و بەبێ ووستی دارێژەر دەکات و هەندێکیش لەسەر ووستی دارێژەر بەجێ دەگاتن ، لەخوارەوە بەخشتە ئەوانە ڕوون دەکەینەوە:

| ناوی سۆفتوێرەکە | کورتە |
|---|---|
| **httpd** | **Apache Hypertext Transfer Protocol Server** |

| | |
|---|---|
| | پرۆگرامێکی سەر وویب سێرڤەرە بەشێوەیەکی خۆکارانە دامەزراوە.<br>کورتکراوەی کۆماندەکانی:<br>**httpd [ -d serverroot ] [ -f config ] [ -C directive ] [ -c directive ] [ -D parameter ] [ -e level ] [ -E file ] [ -k start\|restart\|graceful\|stop\|graceful-stop ] [ -R directory ] [ -h ] [ -l ] [ -L ] [ -S ] [ -t ] [ -v ] [ -V ] [ -X ] [ -M ] [ -T[** |
| **apachectl** | یارمەتیدەری بەڕێوەبەرایەتی **Httpd** |
| **ab** | لەسەر **Apache Hypertext Transfer Protocol Server** دامەزراوە ، کاری ئەوەیە پێت ڕا بگەیەنێت کە ئەپاچی کاری دامەزراندنی هەنوکەیی خۆی بەڕێدەکات ، وە مۆنیتەرکردنی بەیانەکان لە چرکەیەکدا بۆ هەموو گۆڕاوەیەك. |
| **dbmmanage** | بەکاردێت بۆ درووستکردن و ئەپلۆدکردنی فایلاتی **DBM** بۆ تۆمارکردنی بەکاربەر و ووشەی تێپەڕەکەی. |
| **htcacheclean** | سۆفتویێرێکە کە بەنهێنی و بە ئاشکرا ، کار دەکات بۆ پاککردنەوەی فایلە قەبارە زیادە بێ کەڵکەکان و ئەو فایلانەش کە پوچەڵن.<br>کورتکراوەی کۆماندەکانی:<br>**htcacheclean [ -D ] [ -v ] [ -t ] [ -r ] [ -n ] [ -Rround ] -ppath [-llimit\| -Llimit]**<br><br>**htcacheclean [ -n ] [ -t ] [ -i ] [ -Ppidfile ] [ -Rround ] -dinterval -ppath [-llimit\| -Llimit]**<br><br>**htcacheclean [ -v ] [ -Rround ] -ppath [ -a ] [ -A ]**<br><br>**htcacheclean [ -D ] [ -v ] [ -t ] [ -Rround ] -ppath url** |
| **htdigest** | **manage user files for digest authentication**<br>بەکاردێت بۆ ئەپلۆد کردن و دروستکردنی فلات فایلەکان ، ئەوانەی کە کاریان بە بەکاربەر و ووشەی تێپەڕ کردووە ، بۆ ووێنە **htpasswd**. |
| **htdbm** | یەکێکە لە دەستکاریکراوە ، یاخود زیادکراوەکانی **DBM** بۆ تۆملرکردنی بەکاربەر و ووشەی تێپەڕ لەسەر وویب سێرڤەر بەکاردیت. |
| **Htpasswd** | سەیری **htpasswd** بکە. |

| | |
|---|---|
| **httxt2dbm** | بۆ درووستکردنی فایلێکی داتابەیز بەکاردێت لە پێکهێنانی **RewriteMap.** |
| **log_server_status** | وەك ئاماژەمان پێداوە ، بۆ پیشاندانەوە و تۆمارکردنی هەموو تۆمارکراوەکانی سەر وویب سێرڤەرەکەیە. |
| **split_logfile** | هەموو تۆمارکراوەکان دابەش دەکاتن. |
| **Suexec** | کار بە شێڵەکان دەکات بۆ ووێنە **exe.** |

---

لێرەدا ئەوەندە بەسە کە فایلەکە بەشێوەیەکی سەرەتایی ناساندمان ، چیتر لەمەودوا دێین هەندێك نموونەی جێبەجێکاری دێنینەوە ، بەڵکو بابەتەکە کەمێك پێشتر بخەین ، چونکە دڵنیام کەسانی تەمبەڵ حەز بەو بابەتانەی لەمەوپێش باسکران ناکەن و حەز دەکەن ڕاستەوخۆ نموونەی جێبەجێکاری ببینن بەبێ تێگەیشتن لەناوەڕۆك ، ئەوان حەز بە کۆپی دەکەن ، بەهەرحاڵ من لێرەدا چەند نموونەیەك دێنمەوە کە لەگوزەرکردنی هۆستەکەمان بۆ کاری بەڕێوەبەرایەتی گرنگە و پێویستە هەموو گەشەپێدەرێکی بواری وویب بیزانێت.

**نموونەکانی جێبەجێکاری لەسەر فایلی htaccess.**

**گەڕانەوەی خۆکارانەی هەڵەکانی پەیج Error Pages**

ئەم هەڵانە وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێدان زۆرن و هەریەکەك لەو هەڵانە کۆدی تایبەت بەخۆی هەیە ، کۆدەکانیش بەهەمان شێوە پۆلێنکراون بۆ چەند بەشێك بۆ ئەوەی لەیەکدی جودا بکرێتەوە کامە هەڵەی تایبەت بە وویب سێرڤەرە و کامەش لەسەر کلاێنت هەڵەکە درووست دەبێت و هەتادوایی ، لێرەدا کاری فایلەکە بەنووسینەوەی چەند سکریپتێك دەست پێدەکات ، لەخوارەوە و لەداهاتوودا ئێمە سکریپتەکان بەنموونە دێنینەوە ، وە ئەگەر پێویست بکات کەمێك شیکردنەوە دەدەینە ئەو سێنتاکسەی کە گرنگە.

نموونەی هەڵەکانی پەیج بەسانایی:

**ErrorDocument 400 /errors/bad.html**
**ErrorDocument 401 /errors/authreqd.html**
**ErrorDocument 403 /errors/forbid.html**
**ErrorDocument 404 /errors/notfound.html**
**ErrorDocument 500 /errors/servererrors.html**

..هتد

شیکردنەوەی (**ErrorDocument 400 /errors/bad.html**) بۆ تێگەیشتن لەوانی دیکەش:

**ErrorDocument:** یەکێکە لە (ئیلیمێنت)ەکانی سکریپتەکانی فایلی **htaccess** کە بۆ گەڕانەوەی خۆکارانەی هەڵەکانی پەیج درووستکراوە.

**400**: ژمارە کۆدی ئەو هەڵەیە کە ڕێڕەوەکەی پێ دەستنیشان دەکەیت ، واتە کاتێك لەسەر دیوی کلاینت ئەم هەڵەیە ڕوویدا بەهۆی (کێشە / کێشەکان)ەوە مەرج بۆ هەڵەکە دادەنێت.

**/errors/bad.html**: ڕێڕەوی پیشاندەر.

**/errors/**: ئەو (**sub folder**) ، ڕێڕەوی پیشاندەری خۆکارانەیە بۆ جۆری هەڵەکە کە **400**یە ، ئەم ڕێڕەوە ناجێگیرە و تۆ دەتوانی (ناوێك ، ڕێڕەوێك)ی دیکە درووست بکەیت لەسەر هۆستەکەت ، بۆ نموونە:

**Halakan/HalaeClient/HalaeZhmara_400.html**

یاخود:

**HalaeZhmara_400.html**

..هتد.

**bad.html**: بریتیە لەو فایلەی کە خۆکارانە دەکریتەوە لەکاتی بوونی هەڵەکەدا ، واتە ئەم فایلە پیشان دەدات بەمەرجێ هەڵەکە هەبێت ، ئەم ناوە ناجێگیرە و تۆ دەتوانی (ناوێك ، پاشگرێك)ی دیکە درووست بکەیت ، بۆ نموونە:

**400.html**

**Halae400.html**

**ClientErr-400-.html**

**ClientErr-400-.php**

**ClientErr-400-.asp**

..هتد.

لەناو فایلەکەشدا دەتوانین بەئارەزووی خۆمان زمانەکانی ووێب دابڕێژین ، بەمەرجێ لەگەڵ هەڵەکەدا یەك بگرێتەوە ، بۆ نموونە:

```
<html>
<body style="text-align:center;">
<h4>هەڵەی 400</h4>
<h2>ئەم هەڵەیە نەناسراوە تۆمارکراوەیەك لە سکریپتەکان وەگەڕ نەخراوە ، جۆر 400</h2>
</body>
</html>
```

هەڵەی 400

ئەم هەڵەیە نەناسراوە تۆمارکراوەیەك لە سکریپتەکان وەگەڕ نەخراوە ، جۆر 400

هەروەها دەتوانین بەم شێوەیە لەناو فایلەکەدا هەڵەکە ڕێك بخەینەوە:

```
ErrorDocument 400 "<body bgcolor=#ffffff><h1>You have
 to actually <b>BE</b> a <a href="#">member</A> to view
this page, Colonel!
```

کۆدەکە زۆر بەسادەیی دامانڕشتووە ، دەتوانین ئەوەش پێش بخەین ، بەڵام نموونەکە بەسە بۆ تێگەیشتن...

نموونەی چالاککردنی **SSL**

```
AddType text/html .shtml
AddHandler server-parsed .shtml
Options Indexes FollowSymLinks Includes
```

شیکردنەوە:

**AddType text/html .shtml**: بەسێرڤەر ڕادەگەیەنیت کە ئەو پەیجەی بەنموونە وەرگیراوە لەسەر پاشگرەکانی هـەڵەن و پێویستە بگەڕێنەوە.

**AddHandler server-parsed .shtml**: چالاککردنی **ssl** تەنها لەجۆری فایلی دیاریکراو کە پاشگرەکانی دامەزراوبێت ، بۆ نموونە **shtml.**

سەیری **SSL** بکە...

نموونەی (ڕێگەپێدراو ، ڕێگەپێنەدراو)ەی **IP**

لێرەدا دەتوانین وا لە (هۆست ، ووێب سێرڤەر) بکەین ، کە هەرچی **IP**یەك لەسەر (**ISP** ، گرووپێکی دیاریکراو ، شارێك ، ووڵاتێك ، ناوچەیەك ، کەسێك) بکەین هەرکات هۆستەکەیان کردەوە ، ڕاگەیەنراوەیەك بدات ، یاخود ئەو هۆستە بلۆك ببێت لەسەر **IP**یەکان.

```
order allow,deny
deny from 123.123.123.123
allow from all
```

شیکردنەوە:

دێڕی یەکەم (**order allow,deny**) سێنتاکسێکی ناو سکریپتەکەیە ، بۆ چالاککردنی ئەو نموونەیە دەبێت لەسەرەتاوە ئەم ڕاگەیەندراوە بناسێنین و سێنتاکسەکەش لەسەر ئەمە بەندە.

**deny from 123.123.123.123**: نموونەی ئەو ئاپییە وەردەگرێت ، واتە تەنها ئەم ئاپییە (ڕێگەپێنەدراو / **deny**)یە بۆ بەکارهێنانی هۆستەکە.

پاشان (**allow from all**) ، واتە هەموو ئەوانی دیکە ڕێگە پێدراو بن.

نموونەکە پێش دەخەین:

```
order allow,deny
```

```
deny from 159.159.159.55
deny from 123.123.123
allow from all
```

زیادکراوەکە:

```
deny from 123.123.123
```

واتە IP سەرەوە ڕیگەپێنەدراو بێت ، لەگەڵ هەموو ئەو IPیانەی لەم ڕەینجەدان ، بۆ نموونە:

123.123.123.1 - 123.123.123.2 - 123.123.123.3 .... 123.123.123.255

نموونە دەخەینە سەر هۆستێك ، بەهەڵەی 403:

لێرەدا ئەم نموونەیە درووست دەکەین ، کاتێك کلاینت ، یاخود IP نووسراوی سکریپتەکە هۆستەکەی کردەوە چۆن کارا ببێت؟

```
ErrorDocument 403 http://www.yahoo.com/
Order deny,allow
Deny from all
Allow from 123.123.123.123
```

هەرکات هەڵەکە بریتی بوو لە 403 ، وە هەرکات IPی 123.123.123.123 داخڵ بە هۆستەکە بوو ئەوا ڕاستەوخۆ (خۆکارانە) هۆستەکە بکرێتەوە وەك خۆی. بەڵام ئەوانی دیکە بگەڕێنە سەر (یاهو yahoo).

یاخود:

```
Allow from 123.123.123
Allow from 123.123
Allow from 123
```

یاخود IPیەك لەسەر ڕەینجێك تاکو 255:

```
Allow from 123.123.123.0/24
```

ئەو نموونەیە بەم شێوەیە گۆ دەکرێت:

123.123.123.1 – 123.123.123.2 ... 123.123.123.255 = 123.123.123.0/24

سەیری نموونەکەی پێشتر بکە.

دەتوانین سکریپتەکە پێش بخەین بە تایبەتمەندی پاشگرەی فایلەکان ، بۆ ووێنە لەسەر هەموو پاشگرەیەك ئەم سکریپتە کارابێت:

```
<FilesMatch "(.*)">
SCRIPT
</FilesMatch>
```

خۆت دەتوانی بەئارەزووی سکریپت بنووسیت...

ڕێگەپێنەدانی سەردانکەران لەهەمبەر بەشێك

بەشێك لەهۆستەکە (زمان ، ستایڵ ، لق ..هتد) بلۆك دەکەیت ، ئەمەش بۆ لایەنی پاریزگاری لە هاك گرنگە.

تاکە یەك لقبەند بەم شێوەیە ڕێگە پێنەدراوە:

```
RewriteEngine on
# Options +FollowSymlinks
RewriteCond %{HTTP_REFERER} blocksite\.com [NC]
RewriteRule .* - [F]
```

**Blocksite**: نموونەی ئەو سایتە دادەنێیت کە دەتەوێت ترافیك بێتە سەر هەڵەیەك ، واتە ئەم دۆمەینە بلۆك دەکات.

هەڵەکە دەگوێزرێتەوە بۆ هەڵەی ژمارە **403** ، سەیری هەڵەی **403** بکە.

دەتوانین بە لابردنی **#** ی دێڕی دووەم ئەو کۆمێنتە لاببەین ، ئەگەر دایرێکتەی وویب سێرڤەرەکە لەسەر **FollowSymlinks** کۆنفیگەر نەکرابوو لەناو فایلی **httpd.conf** ، ئەوا دەگەڕێتەوە سەر هەڵەی **500** (**Internal Server error**).

تێبینی/ ئەم سێنتاکسە لەکاردا نابێت ئەگەر (**mod_rewrite**) لەسەر وویب سێرڤەر چالاك نەکرابێت ، ئەوکات لەهەموو بارێکدا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەکە و هۆستەکە لەکار دەکەوێت.

یاخود دەتوانین بۆ چەند (زمان ، ستایڵ ، لق ..هتد)یکی جودا بەکاری بهێنین:

```
RewriteEngine on
# Options +FollowSymlinks
RewriteCond %{HTTP_REFERER} blocksite\.com [NC,OR]
RewriteCond %{HTTP_REFERER} anotherblocksite\.com
RewriteRule .* - [F]
```

ڕێگە نەدان بە چەند پاشگرێك:

```
RewriteEngine on
# Options +FollowSymlinks
RewriteCond %{HTTP_REFERER} !^$
RewriteCond %{HTTP_REFERER} !^http://(www\.)?mydomain.com/.*$ [NC]
RewriteCond %{HTTP_REFERER} !^http://(www\.)?anotherexample.com/.*$ [NC]
RewriteRule \.(gif|jpg|exe|png|js|css)$ - [F]
```

یاخود:

```
<Files ~ "\.gif">
Order allow,deny
Deny from all
</Files>
```

نموونەی **gif** بلۆك دەكات ، دەتونی نموونەكە پێش یخەیت بۆ **IP**یەك یان رەینجێك وە هەتا دوایی.

دانانی ماوە بۆ داونلۆدكردنی (جۆرێك ، چەند جۆرێك)ی فایل:

```
ExpiresActive On
ExpiresByType image/gif "access plus 1 year"
ExpiresDefault "access plus 2 days"
```

رێگەنەدان بە رۆڵە خراپەكان **Bad bots**

ئەم بەشە گرنگە بۆ خۆپاراستن لە (هێرشەكان ، پرۆگرامە دەرەكیەكان ، ئیمەیڵە ئیزعاجەكان ، بوتەكان ، سپامەرەكان..هتد) ، **Bad bots** ، مەبەست لەو سەرچاوە خراپانەیە كە كار لە هۆستەكە دەكەن لەڕووی (خاوی ، پاراستن)ەوە ، وە دەیانەوێت شتێك زیاد یان كەم بكەن لەرێگەی **SEO** ، بۆ نموونە پرۆگرامێكی داونلۆدەری خراپ وەك (**ReGet**) كەبۆ داولۆد كردن بەكاردێت كاردێت كار لەخاوكردنەوەی هۆستەكە دەكات ، بەهۆی ناردنی پاكێجی زیادە و بەردەوام ، ئەمەش بە رۆڵی خراپ ئەژمار ئەكرێت ، بۆیە دەچێتە لیستەكەوە ، وە ئیمەیڵی ئیزعاج مەبەست لەوەیە كە لەدەروە زۆر و زەوەندە پەیوەندی دەگرێت بە بەكاربەرانی هۆستەكە یاخود خودی هۆستەكە ، وە هەتا دوایی.

ئەم سكریپتانە تێكرا رێگە پێدراوە لەلایەن فایلی (**robots.txt**) ، كەفلات فایلێكی جێبەجێكاریە و رێگە پێدراوە و رێگە پێنەدراوە رادەگەیەنێت ، بۆ ووێنە (لقبەندەكان ، رێرەوەكان ، سەرچاوەكان ، ..هتد) ، فایلەكە خۆی هەمیشە **Allow** ، رێگە پێدراوە لەسەر (**www.example.com/robots.txt**)، بۆ نموونە (فەیسبووك و گووگڵ)

**https://www.facebook.com/robots.txt**

```
# Notice: Crawling Facebook is prohibited unless you have express written
# permission. See: http://www.facebook.com/apps/site_scraping_tos_terms.php

User-agent: baiduspider
Disallow: /ajax/
Disallow: /album.php
Disallow: /checkpoint/
Disallow: /contact_importer/
Disallow: /feeds/
Disallow: /file_download.php
Disallow: /l.php
Disallow: /p.php
Disallow: /photo.php
Disallow: /photo_comments.php
Disallow: /photo_search.php
Disallow: /photos.php
Disallow: /sharer/

User-agent: Googlebot
Disallow: /ajax/
Disallow: /album.php
Disallow: /checkpoint/
Disallow: /contact_importer/
Disallow: /feeds/
Disallow: /file_download.php
Disallow: /l.php
Disallow: /p.php
Disallow: /photo.php
Disallow: /photo_comments.php
Disallow: /photo_search.php
Disallow: /photos.php
Disallow: /sharer/
```

**https://www.google.com/robots.txt**

```
User-agent: *
Disallow: /search
Disallow: /sdch
Disallow: /groups
Disallow: /images
Disallow: /catalogs
Allow: /catalogs/about
Allow: /catalogs/p?
Disallow: /catalogues
Disallow: /news
Allow: /news/directory
Disallow: /nwshp
Disallow: /setnewsprefs?
Disallow: /index.html?
Disallow: /?
Allow: /?hl=
Disallow: /?hl=*&
Disallow: /addurl/image?
Allow:    /mail/help/
Disallow: /mail/
Disallow: /pagead/
Disallow: /relpage/
Disallow: /relcontent
Disallow: /imgres
Disallow: /imglanding
Disallow: /sbd
Disallow: /keyword/
Disallow: /u/
Disallow: /univ/
Disallow: /cobrand
```

بەهەرحاڵ ، نموونەکە کەمێك هێڵ و ووشەکانی زۆرن ، بابەت جێی نابێتەوە ، بۆیە کورتی دەکەینەوە بەم شێوەیە لەناو فایلی **.htaccess** ، ئەنووسرێت:

**ewriteEngine On**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^BlackWidow [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^Bot\ mailto:craftbot@yahoo.com [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^ChinaClaw [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^Custo [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^DISCo [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^Download\ Demon [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^eCatch [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^EirGrabber [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^EmailSiphon [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^EmailWolf [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^Express\ WebPictures [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^ExtractorPro [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^EyeNetIE [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^FlashGet [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^GetRight [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^GetWeb! [OR]**

**RewriteCond %{HTTP_USER_AGENT} ^Go!Zilla [OR]**

**RewriteRule ^.* - [F,L]**

## گۆڕینی ڕێڕەوی خۆکار

کاتێك (هۆستیك ، ڕێڕەوی هۆستێك) دەکەیتەوە ، ڕاستەوخۆ دەچێە سەر ئەو (ڕێڕەو ، فایل)ەی کە وویب سێرڤەری هۆستەکە بۆی دەستنیشان کردووی ، بۆ نموونە:

**www.example.com/**

**www.example.com/index.php**

یاخود:

**www.example.com/sub/**

**www.example.com/sub/index.php**

بەکارهێنەر ناوی فایلەکە نانووسێت هەتا بچێتە سەر ڕێڕەوەکە ، لێرەدا فایلی **htaccess** هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی ئەو کردارە:

**DirectoryIndex index.php**

یاخود ئەگەر فایلی یەکەم نەبوو ، بچێتە سەر دووەم ، وە هەروەها...

**DirectoryIndex index.php filename.html index.cgi index.pl default.htm**

## گۆڕین و نووسینەوەی کورتهێنانی ڕێڕەوەکان

کارێکی گرنگی فایلەکە (**rewriting** و **redirecting**)ە ، کە لینکەکان و ڕێڕەوەکان کورت دەکاتەوە و دەیانگۆڕێت ، بەڵام ئەم گۆڕانە تەنها ڕووکەشە و لەسەر ووێب سێرڤەر هەمان بنەڕەت بەکار دەهێنێتەوە.

## کورتهێنانی ڕێڕەوی پاشگرێك

```
Options +FollowSymlinks
RewriteEngine on
RewriteRule ^files/([^/]+)/([^/]+).zip /download.php?section=$1&file=$2 [NC]
```

لەلای بەکاربەر بەم شێوەیە دەنووسرێتەوە:

**http://example/files/games/hoopy.zip**

لەسەر ووێب سێرڤەر:

**http://example/download.php?section=games&file=hoopy**

یاخود:

```
Options +FollowSymlinks
RewriteEngine on
RewriteRule ^blog/([0-9]+)-([a-z]+) http://example.com/blog/index.php?archive=$1-$2 [NC]
```

لەلای بەکاربەر بەم شێوەیە دەنووسرێتەوە:

**http://example.com/blog/2014**

لەسەر ووێب سێرڤەر:

**http://example.com/blog/index.php?archive=2014**

## کورتکردنەوەی لینك (لقبەند)

ئەم کورتکردنەوەیە لەسەر (**redirecting**)ی ناو هۆستەکەت دامەزراوە ، واتە کار بەدەرەوەی هۆستەکەت ناکات ، نموونە:

```
Options +FollowSymlinks
RewriteEngine On
RewriteRule ^text /public/files/download/download.php
```

**Text** ئەو ووشەیە کە لەناو ڕێڕەوەکەدا بەندە:

لەلای بەکاربەر بەم شێوەیە دەنووسرێتەوە:

**http://example/text?file=ex.rar**

لەسەر وویب سێرڤەر:

**http://example/public/files/download/download.php?file=ex.rar**

نموونەی گۆڕینی ڕێڕەو:

**Redirect /olddirectory/oldfile.html http://yoursite.com/newdirectory/newfile.html**

نموونەی وونکردنی **www**ی دۆمەینەکەت

```
Options +FollowSymlinks
RewriteEngine on
RewriteCond %{http_host} ^www\.example\.com [NC]
RewriteRule ^(.*)$ http://example.com/$1 [R=301,NC]
```

لەلای بەکاربەر بەم شێوەیە دەنووسرێتەوە:

**example.com**

لەسەر وویب سێرڤەر:

**http://www.example.com/index.php**

## زیادکردنی Internet media type

ئەم بەشە بۆ زیادکردنی **MIME** ، کە بریتین لە چەند ئەپڵیکەشنێك بۆ بزواندنی پاشگرەکانی تایبەت بە جۆری ئەپڵیکەیشنەکە لەسەر ئینتەرنێت ، بۆ نموونە (**x-shockwave-flash swf**) ، فــلاش ، **mp3** ، **mp4**..هتد:

**AddType application/x-shockwave-flash .swf**

بۆ داونلۆدکردنی **pdf** :

**AddType application/octet-stream .pdf**

چەند نموونەیەکی دیکە:

```
AddType audio/mpeg .mp3
AddType audio/x-mpegurl .m3u
AddType audio/x-ms-wma .wma
AddType audio/x-ms-wax .wax
AddType video/x-ms-asf .asf
AddType video/x-ms-asx .asx
AddType video/x-ms-wmv .wmv
AddType video/x-ms-wvx .wvx
```

وە هەتا دوایی...

چەند نموونەیەکی سادەی دیکە:

دانانی **Timezone** بۆ سێرڤەرەکە

**SetEnv TZ America/Indianapolis**

ڕێگەدان بە ڕێنووسەکان

**AddDefaultCharset UTF-8**

**DefaultLanguage en-US**

ڕێگەنەدان بە چەند پاشگرێك لە **URL**

**Options -ExecCGI**

**AddHandler cgi-script .php .pl .py .jsp .asp .htm .shtml .sh .cgi**

نموونەی پاشگرەکان ئاڵوگۆڕ بکە.

میتۆدەکان و وەڵامەکان لەسەر کلاینت لابەرە

**RewriteCond %{REQUEST_METHOD} !^(GET|HEAD)**

**RewriteRule .* - [F]**

پیشاندانی کۆدەکانی **CGI**

**RemoveHandler cgi-script .pl .py .cgi**

**AddType text/plain .pl .py .cgi**

بلۆککردنی وولاتێك

**http://incredibill.me/htaccess-block-country-ips**

بلۆك کردنی زمانێك لەسەر ووێبگەڕ **-Korean-**

**http://incredibill.me/htaccess-block-language**

**RewriteEngine On**

**RewriteCond %{HTTP:Accept-Language} (ko)$ [NC]**

**RewriteRule .* - [F,L]**